# 52 پرسیاری
# فەلسەفی، لۆجیکی و کۆمەڵایەتی

بۆ منداڵان، قۆناغی سەرەتایی

نووسینی

## کەریم مستەفا

وەشانی کۆمەك 2006©

سلێمانی - کوردستان
www.komak.nu



" هەرگیز ستایشی وەڵام مەکە، بەڵام هەمیشە ڕێز لە پرسیار بگرە! "

لەڕۆمانی ( هەلەو، کێ لێرەیە؟) نووسینی، یوستەین گاردەر، ١٩٩٦ ئۆسلۆ

ناوی کتێب : 52 پرسیاری فەلسەفی، لۆجیکی و کۆمەڵایەتی
نووسەر : کەریم مستەفا
وەشانی کۆمەك 2006 سلێمانی
تیراژ : 1000 دانە
چاپخانەی : ...............
ئادرێس : سلێمانی، شەقامی ........



## ڕوونکردنەوە

هەموو ئەوانەی لەگەڵ منداڵانداکاردەکەن، چ لە زاڕۆخانە و چ لە قوتابخانە سەرەتاییەکاندا و دایکان و باوکانیش، گەلێ جار ڕووبەڕووی پرسیار گەلێکی سەخت، لەلایەن منداڵانەوە، دەبنەوە. منداڵان زۆربەیان گچکە فەیلەسوفێکن و پرسیاری زۆر سەخت دەکەن، کە وەڵامدانەوەیان ئاسان نیە. گەر وەڵامیشیان بدرێتەوە، دیسان دەبێتە مایەی پرسیاری نوێ، لەلایان.
ئایا دەبێت گەورەکان وەڵامی گشت پرسیارێکی منداڵان بدەنەوە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە، بەڵێ و نەخێرە. بەڵێ دەبێت وەڵامی ئەو پرسیارانەیان بدەینەوە، کە وەڵامەکانیان دەزانین. نەخێر نابێت وەڵامی پرسیارێکیان بدەینەوە، کە خۆمان وەڵامەکەی نازانین و زۆر ڕاشکاوانە، بڵێین "نازانم". گەرچی دەشێ"نازانم" کەمێ منداڵ نائومێدبکات، چونکە زۆربەی منداڵان پێیانوایە، گەورەکان وەڵامی گشت پرسیارێکیان لەلایە، بەڵام بەبارێکی دیکەدا، دەروازەیەکی دیکە بۆ بیرکردنەوەی منداڵان ئاواڵەدەکەینەوە، کە خۆیان عەوداڵی پەیداکردنی وەڵام بن. دیسان"نازانم" ئاماژەیەکی دیکەیان پێدەدات، کە پرسیارگەلێك هەن، وەڵامەکانیان هەروا ئاسان نیە و بیرکردنەوە و خۆماندووکردنی دەوێت. نابێت لەو ڕوانگە چەوتەوە هەڵسوکەوت لەگەڵ منداڵدا بکرێت، کە منداڵ"منداڵە" و دەکرێت بە هەر وەڵامێك قایل بێت. ئەوانەی بەو دیدەوە لە منداڵان دەڕوانن، دەبێ لەو فاکتە تێبگەن کە منداڵ پرسیاری گەلێ سەخت و ئاڵۆزی بەخەیاڵدا دێن، کە گەورەکان لەبەرانبەریاندا، دۆشدادەمێنن و هیچ وەڵامێکیان پێنیە!
ئەوە ئەنگێزەی پرسیارکردنە، وا لە منداڵ دەکات، لەخۆی، کەسانی دیکە، ژینگە، کلتور، کۆمەڵ، یاساوڕێسا و ئایین، تێبگات.
لەو ڕوانگەیەوە، کە هیچ پرسیارێك بێمانا و بێمەبەست نیە، دەبێت منداڵ ئازادی تەواوی هەبێت لە پرسیارکردندا و نابێت بەهیچ بیانویەکی، دینی و کۆمەڵایەتی و کلتوریەوە، ڕێگەی پرسیارکردنی لێبگیرێت. گەر ئێمە (گەورەساڵان) بڕوامان بەوە هەبێت، کە ژیان خۆی پرسیارێکی گەورە و ئاڵۆزە، ئەوا نابێت خوی پرسیارکردن لە منداڵاندا خەفەبکەین. هەر کاتێك مرۆڤ ئەنگێزەی پرسیار کردنی تێدا خەفەکرا، ئیدی بەهای مرۆڤانەی خۆی لەدەستدەدا و ڕەنگە هەرئەوە کۆتایی مێژووش بێت !
مەبەستی ئەم پرسیارگەلە ئەوەنیە، منداڵان بکات بە فەیلەسوف، یان بە گەنجینەی زانیاری! بەڵکو ئامانج ئەوەیە ئەنگێزە و خوی پرسیارکردنیان زیاتر بهەژێنێت. دەبێت منداڵان بەبۆچوونی خۆیان وەڵامی پرسیارەکان بدەنەوە، تەنها(گەر پێویست بوو) بەمەبەستی ڕوونکردنەوە کۆمەکیان بکرێت. مەرج نیە هەموو پرسیارەکان وەڵامیان هەبێت، ڕەنگە هەندێکیان پرسیار دروستبکەن!
بۆچی 52 پرسیار؟ 52 ژمارەی هەفتەکانی ساڵە و هەر هەفتەی پرسیارێك، تا کات لە ئەرکەکانی قوتابخانە نەگرێت و منداڵیش کاتی تەواوی هەبێت بۆ بیرکردنەوە لە پرسیارەکان. لەکۆتایی هەر پرسیارایکدا، لەکەوانەیەکدا نووسراوە (بنووسە/ پرسیاربکە/ وێنە بکێشە)، ڕەنگە بەیەکێ لەو سێ شێوازە، یان بەهەرسێ شێوازەکە، منداڵ بتوانێت ڕاوبۆچوونی خۆی لەسەر پرسیارەکان دەربڕێت.

کەریم مستەفا ئۆسلۆ، دێسمبەری2005





3- بڕوادەکەیت لە سەر ئەو ئەستێرە بەرزانەی ئاسمان ژیان هەبێت؟ گەر ژیان لەوێ هەبێت، دەبێت ئەو زیندەوەرانەی ئەوێ چۆن بن؟ (بنووسە/ بپرسە/ وێنە بکێشە)





4- بێتە بەرچاوت گەر مرۆڤ وەك ڕووەك لە زەویدا بڕوێت. ئەو کاتە مرۆڤ چۆن دەبێت؟ (وێنە بکێشە/ بنووسە/ بپرسە)





5 - ئایا تۆ جوانیت؟ ژیرو زیرەکیت؟ جوانی وزیرەکی چین؟ (بنووسە/ بپرسە)





7- بڕوا دەکەیت خەڵکی دیکەش هەست بکەن؟ دەتوانی هەستە کانی خۆت و هەستەکانی ئەوان ببینیت؟ چۆن؟
(بنووسە/ پرسیاربکە)





8- ئایا زیندەوەرەکانی دیکە (ئاژەڵ، مێروو، باڵندە، ماسی، ....) هەستیان هەیە؟ هەست بە ئازار دەکەن، یان دڵیان تەنگ دەبێت؟ تۆ هیچ زیندەوەرێکت بینیوە لە کاتی ئازارکێشاندا؟ (بنووسە/ بپرسە)





9- گەر تۆ بتوانیت خۆت بکەیت بە زیندەوەرێکی دیکە، خۆت دەکەیت بە چ زیندەوەرێك؟ بۆ؟ (بنووسە/ وێنە بکێشە)





10- بڕوا دەكەیت، درەخت و گوڵ وگیا، هەستیان هەبێت؟ چ گوڵێك لەلای تۆ جوانترین گوڵە؟ چ میوەیەك لە لای تۆ خۆشترین میوەیە؟ (بنووسە/ وێنە بكێشە/ بپرسە)





12- ئایا مرۆڤ بەبیرکردنەوە خۆی دەناسێت، یان دەبێت خۆی بناسێت، بۆئەوەی بیردەکاتەوە؟ (بنووسە/ بپرسە)



13- ئایا تۆ حەز لە بیستنی گۆرانی و مۆسیقا دەکەیت؟ حەز لە وێنە کێشان دەکەیت؟ حەزت لە تەماشاکردنی پەیکەر هەیە؟ چوویت بۆ سەیری شانۆگەری؟ حەزت لە دانس و هەڵپەڕکێ هەیە؟
(بە هەموو ئەو « کارانە « دەڵێن هونەر و بە ئەو کەسانەی ئەو کارانە دەکەن دەڵێن هونەرمەند) ئێستا دەزانی هونەر چیە؟ حەز دەکەیت ببیت بە هونەرمەند؟ (بنووسە/ بپرسە)

14- حەزدەکەیت وەرزش بکەیت؟ چ وەرزشێك؟ ئایا دەزانی وەرزش بۆلەش ساغی پێویستە؟چۆن دەزانیت لەش ساغیت؟ ئایا لەش ساغی خۆشە؟ (بنووسە/ بپرسە)





15- گەر لەش ساغبیت ، دەبێیت کاربکەیت؟ بۆ پێویستە کار بکەین؟ ئایا ئێمە دەژین بۆئەوەی کار بکەین، یان دەبێت کار بکەین بۆ ئەوەی بژین؟ (بنووسە/ بپرسە)





16- گەر تۆ کەسێکی هاندیکەپ بیت، چۆن کارەکانی ڕۆژانەت دەکەیت؟ گەر هاندیکەپ نیت، ئایا بیر لە کەسانی هاندیکەپ دەکەیتەوە چۆن ئەرکەکانی قوتابخانەیان جێبەجێ دەکەن؟ (بنووسە/ بپرسە)





18- کام وانەیەت لە هەموو وانەکانی دیکە لەلاخۆشترە؟ بۆ؟ (بنووسە)





19- بۆ دەبێت فێری ماتماتیك ببین؟ هەر بۆ ئەوەی بتوانین هەموو "شتێك" بژمێرین؟ ئەی دەزانیت ئەو"شتانە"چین کە ناتوانین بیانژمێرین؟ (بنووسە/ بپرسە)





20- ئایا پێویستە فێری وانە زانیاریەکانی دیکە ببین؟ بۆ، کەڵکیان چیە؟ (بنووسە/ بپرسە)





21- ئایا پێویستە جگە لە زمانی کوردی، فێری زمانی دیکە ببین؟ بۆ؟ جگە لە کوردی، تۆ چ زمانێکی دیکە دەزانیت؟ دەتوانیت بەو زمانە وەڵامی ئەم پرسیارە بدەیتەوە؟ (بنووسە)





22- دەزانیت ساڵێك، چەند هەفتە، چەند ڕۆژ، چەند سەعات و چەند دەقیقەیە؟ تۆ تا ئێستا چەند دەقیقە ژیاویت؟ (بپرسە/ بنووسە)





23- گەر مرۆڤێك تەنها 24 سەعات بژی، بەبڕوای تۆ چۆن کاتەکەی بەکاردەهێنێت؟ تۆ دەتوانی یارمەتی بدەیت و کاتەکانی بۆ ڕێکبخەیت؟ (بنووسە)





24- تۆ چۆن سەعاتەکانی ڕۆژێکی ژیانت بەکاردەهێنیت؟ بۆنموونە لە سەعات 8 ی بەیانی بۆ سەعات 8 ی ئێوارە؟ (بنووسە)





25- دەزانیت دەبێت مرۆڤ لە شەو و ڕۆژێکدا 8 سەعات بخەوێت؟ تۆ چەند سەعات دەخەویت؟ بۆ دەبێت بخەوین؟ ئایا هەموو زیندەوەرێك پێویستی بە خەو هەیە؟ (بنووسە/ بپرسە)





26- زۆربەی ئەو کاتانەی کە تێیدا خەوتوین، خەون دەبینین. تۆ خەون دەبینیت؟ دەتوانی خەونێکی خۆت بگێڕیتەوە؟ (بنووسە)





27- ئایا خەون پەیوەندی بە ڕوداوەکانی ژیانی ڕۆژانەمانەوە هەیە؟ ئەو"شتەی" لە ژیاندا ئاواتەخوازین، دەتوانین لە خەوندا بەدەستی بهێنین؟ تۆ خەونێکت بینیوە و هاتبێتە دی؟ (بپرسە/ بنووسە)





28- بڕوادەکەیت زیندەوەرەکانی دیکە خەون ببینن؟ دەبێت خەون بە چییەوە ببینن؟ دەتوانی خەونێکی خۆت، یان خەونێکی زیندەوەرێکی دیکە وێنە بکێشیت؟ (بپرسە/ وێنە بکێشە)





29- هەوا، ئاو، خاك و ووزە (ئاگر)، سەرچاوەی ژیانن.نابێت پیسبکرێن و زیادەڕۆیی بکرێت لە بەکارهێنانیاندا. بڕوادەکەیت گەر یەکێك لەو سەرچاوانە نەمێنن ژیان بەردەوامبێت؟ بۆ؟ (بپرسە/ بنووسە)





30- ژینگە، ئەو شوێن و دەوروبەرەی لێیدەژین، دەبێت ئاگاداریبین و پاك ڕاییبگرین. بۆ؟ تۆ بەتەنگ ژینگەکەی خۆتەوە دێیت؟ چۆن؟ (بپرسە/ بنووسە)





31- تۆ سروشتت لەلاجوانە؟ چیاوگرد، دەشت و دۆڵ، دارستان و بیابان، کامیانت لەلاجوانترە؟ بۆ؟(وێنە بکێشە/ بنووسە)





32- دەزانیت خۆشەویستی چیە؟ چۆنی پێناسەدەکەیت؟ تۆ کێت، یان چیت زۆر خۆشدەوێت؟ بۆ؟ (بنووسە/ وێنە بکێشە)





33- ئایا تۆ هەمووکەسێکی، یان "شتێکی" خۆشەویستت لەلا جوانە؟ یان هەموو کەسێکی، یان "شتێکی" جوانت لەلا خۆشەویستە؟ بۆ؟ (بنووسە)



34 - کەسانی دیکە (خوشك و براکەت، هاورێکەت) چۆن بزانن کە تۆ خۆشتدەوێن؟ ئایا پێویستە خۆشەویستی دەرببڕێت، یان هەر بە نهێنی بمێنێتەوە؟ بۆ؟ (بنووسە/ بپرسە)





35- مرۆڤ لە سكی دایكیدا بە تەنهایە، كەدەخەوێت هەر بۆخۆی دەخەوێت. كە نەخۆشدەبێت هەر بۆخۆی نەخۆشدەبێت، كە دەشمرێت هەر بۆخۆی دەمرێت.ئایا مرۆڤ تەنهایە یان هەمیشە لەگەڵ كەسانی دیكەدایە؟ (بنووسە/ بپرسە)





36- تۆ هەندێ جار هەست بەتەنهایی دەکەیت؟ بۆ؟ بڕوادەکەیت کەسانی دیکەش هەروەك تۆ، هەندێ جار هەست بەتەنهایی بکەن؟ (بنووسە/ بپرسە)





37- بڕوادەکەیت کەسانی دەوروبەرت هەمیشە، یان هەندێ جار لێتتێدەگەن؟ ئەی تۆ هەمیشە یان هەندێ جار لەواندەگەیت؟ بۆ؟ (بنووسە/ بپرسە)





38- هەندێ جار، بەهەندێ کاری مرۆڤ دەگوترێت هەڵە، چۆن دەزانین کارێك "هەڵەیە"، یان "ڕاستە" گەر کەسانی دەوروبەرت هەڵەیان کرد، ئاگاداریان دەکەیتەوە؟ ئەی تۆ حەزدەکەیت ئەوانیش تۆ لە هەڵەکانت ئاگاداربکەنەوە؟ بۆ؟ (بنووسە/ بپرسە)





39- تۆ حەزدەکەیت، هەرکارێك، یان هەرشتێکت بوێت بکەیت، بێ ئەوەی کەس ڕێگەت لێبگرێت؟ بۆ؟ بڕوادەکەیت کەسانی دیکەش هەمان حەزیان هەبێت؟ (بنووسە/ بپرسە)





40- گەر هەمووکەسێك، هەر کارێکی ویست، بەدڵی خۆی بیکات و هەر شتێکی ویست بە دڵی خۆی، بیبات، بەبڕوای تۆ چی ڕودەدات؟ ئایا ژیان ئاسانتر دەبێت، یان ئاڵۆزتردەبێت؟ (بنووسە / بپرسە)





41- یاسا و ڕێسا، بەرنامە و پلانێکن، مرۆڤ بۆ ڕێکخستنی ژیان و پەیوەندی نێوان تاکەکان و کاروباری ڕۆژانە، دایڕشتون و نووسیونی، بڕوادەکەیت گەر هەموو کەسێك پەیڕەوی ئەو یاسایانە بکات، ژیان خۆشتر یان ئاسانتر ببێت؟ بۆ؟ (بنووسە/ بپرسە)





42- بەگوێرەی یاسا، دەبێت تۆ پەیڕەوی هەموو یاساکان بکەیت، ئەگەرنا، سزادەدرێیت! چۆن دەزانیت ئەوکەسانەی، کە یاساکانیان داناوە، "هەڵە"نین؟ ئەی ئەگەر یاسایەکت بەدڵ نەبوو، هەر پەیرڕەویدەکەیت؟ بۆ؟ (بنووسە)





43- جلوبەرگ پۆشین. مافێکی تایبەتی تاکەکەسە، بەڵام هەر لەو ڕۆژەوەی لەدایکدەبین، خێزان، کلتور، دین، ڕیساکانی ناو کۆمەڵ، بڕیاردەدەن، ئێمە چ جۆرە جلوبەرگێك بپۆشین ! ئایا ئێمە دەتوانین (لەهەرشوێنێك و لەهەر کاتێکدا) ئەو جلوبەرگەی حەزمان لێیەتی، بیپۆشین؟ (بنووسە)

44- فەیلەسوفێك گووتویەتی : "دەبیت بەوشتەی کەدەیخۆیت". ئایا تۆ پێش ئەوەی خواردنێك بخۆیت، بیرلە خواردنەکە دەکەیتەوە؟ ئایا گەر تۆ، سێوێك یان گۆشتی ماسی و بەرخ و مریشك بخۆیت، ئیدی دەبیت بەوانە؟ (بنووسە)





45- هەموو مرۆڤێك شیاوی ئەوەیە ڕێزی لێبگیرێت! بەڵام (لە هەندێ کات و هەندێ شوێندا) هەندێ کەس بەهۆی (دەستەڵات، دەوڵەمەندی، پلەی زانستی و ڕۆشنبیری و هونەری و ڕووخسار) یانەوە، ڕێزی زۆرتریان لێدەگیرێت. ئایا تۆ ڕێز لە خودی مرۆڤەکان دەگریت، یان پلەوپایەیان؟ بۆ؟ (بنووسە)





46- بە، شیعر، چیرۆك، ڕۆمان، پەخشان و دراما، ... دەگووترێت ئەدەب. زۆرکەس بڕوایان وایە کە ئەدەب، ژیان جوانتر دەکات! تۆ دەڵێیت چی؟ بێنەبەر چاوت، گەر ئەوانە هیچیان نەبوونایە، ئایا ئەوکاتە ژیان چۆن دەبوو؟ ئایا تۆ کام لەو بابەتانەی ئەدەب دەخوێنیتەوە؟ بۆ؟ (بپرسە/ بنووسە)





47- بۆ دەبێت منداڵ بەقسەی دایك و باوك و مامۆستا و كەسانی لەخۆی گەورەتر، بكات؟ ئەی ئەگەر ئەو گەورانە "هەڵە "بن، هەردەبێت بەقسەیانبكات؟ ئایا دەبێت منداڵ بەقسەی كەسێكی گەورە بكات كە نەیناسێت؟ بۆ؟ ئایا تۆ تەنها بەقسەی ئەوكەسانە دەكەیت كە دەیانناسیت؟ بۆ؟ (بنووسە)





48- کاتێك کە داوات لێدەکەن، کارێك بکەیت، یان ئەرکێك جێبەجێ بکەیت، لەبەر چی ئەو کارە، یان ئەو ئەرکە، جێبەجێ دەکەیت :

- لەبەر ئەوەی بڕوات بەو کارە، یان ئەرکە هەیە؟
- لەبەر ئەوەی کەسێکی لە خۆت گەورەتر داوای لێکردوویت؟
- لەبەر ئەوەی یاسا بڕیاری داوە؟
- لەبەر ئەوە ئەو کارە، یان ئەرکە خۆشە؟
- لەبەر ئەوەی لەوە دەترسیت گەر ئەو کارە یان ئەرکە جێبەجێ نەکەیت سزابدرێیت؟ (بنووسە/ بپرسە)

49- ئایا پێویستە یارمەتی کەسانی دیکە بدەین؟ بۆ؟ ئایا دەبێت تەنها یارمەتی ئەوکاسانە بدەین کە دەیانناسین، یان یارمەتی هەرکەسێك بدەین، کە پێویستی بەیارمەتی هەبێت؟ (بنووسە/ بپرسە)





50- کاتێك کە یارمەتی کەسێك دەدەین، ئایا ئەوکارە بۆ ئەوەدەکەین تا دڵی خۆمان خۆشبکەین، یان دڵی ئەو کەسە خۆشبکەین؟ (بنووسە)



51- بڕوادەکەیت، مرۆڤ و زیندەوەر و ڕوەك و سروشت و کەون، هەرلەخۆوە دروست بووبن؟ یان خودا دروستی کردوون؟ (بنووسە / بپرسە)





# 52
# PHILOSOPHICAL,
# LOGICAL AND SOCIAL QUESTIONS

**FOR CHILDREN**

BY : KARIM MUSTAFA

KOMAK, 2006
www.komak.nu
PRINTED IN SULAIMANY – KURDSTAN



